زنجيرەی چيرۆكی گيانلەبەران لە قورئانی پيرۆز بۆ منداڵان

٤

# هەنگ و هەنگوين





هۆنراوەی : مەرسوم گەشبين

نيگـــار : دڵشـاد عـەلی

التفسير

هەولێر

١٤٢٥ك ٢٠٠٤ز

زنجیرەی چیرۆکی گیانلەبەران لە قورئانی پیرۆز بۆ منداڵان

٤

# هەنگ و هەنگوین

هۆنراوە : مەرسوم گەشبین

نیگـــار : دڵشـــاد علـی

تفسیر

هەولێر/ شەقامی دادگا ت: ٢٢٢١٦٩٥ ـ ٢٢٣٠٩٠٨

tafseeroffice@maktoob.com. - altafseer@hotmail.com.

ناوی نامیلکە : هەنگ و هەنگوین

هۆنراوەی : مەرسوم گەشبین

بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر

نیگار و نەخشەسازی: دڵشاد عەلی

ساڵی چاپ : ١٤٢٥ك - ٢٠٠٤ز

نۆرەی چاپ : یەکەم

چاپکردنی : چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەولێر

تیراژ : ٤٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن : ٣٤ ساڵی ٢٠٠٣

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ : وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٦٩﴾

واتە: خوا مێشەنگوینی ڕاسپارد، کە لە چیا و داران و ئەو شوێنەی هەڵیدەبەستن، شوێنی ژیانی خۆت هەڵبەستە و ساز بکە. پاشان لە گشت بەروبوم و اشیلەی گوڵان و شتی بەسود) بمژە؛ ئیتر-بە ملکەچی- ڕێگەی پەروەردگارت بگرە بەر.. کە لەناو سکی ئەم هەنگانەوە شلەیەکی ڕەنگ جیاواز دێتە دەرەوە، کە شیفایە بۆ ازۆر نەخۆشی) بۆ خەڵکی، بەڕاستی ئا لەمەشدا بەڵگە و نیشانەی بەهێز هەیە بۆ کەسانێ، کە بیر بکەنەوە اسەرنج بدەن لە هەنگ و شانەکانی لە فڕین و هاتوچۆی، لە هەنگوین و تام و... هتد.)

عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ : إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ قَتْلِ أَرْبَعٍ مِنْ الدَّوَابِّ النَّمْلَةُ وَالنَّحْلَةُ وَالْهُدْهُدُ وَالصُّرَدُ (سنن أبي داود وابن ماجه وأحمد)

واتە : ئیبن عەباس گوتویەتی: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە، کە نابێ چوار لە زیندەوەران بکوژرێن: مێروڵە، هەنگ، پەپوی سولەیمان، پەڕبەڵەکە اچۆلەکەگرە) .



هەنگ: زیندەوەرێکە لە سەرانسەری جیهان دەژی، لەگشت زیندەوەران زیاتر سودی هەیە، کە هەنگوین بەرهەم دێنێ و خەڵک دەیخۆن، هەروا شەمێ بەرهەم دێنێ، کە بۆ کەتیرە و کەرەستەی ئارایشت بەکار دێت.
هەنگ ( ٢٠٠٠٠ ) جۆری هەیە و شیلەی گوڵ دەمژێت، گەورەترین هەنگ درێژی ٢٠ ملیمەترە.
دەتوانێ بەخێرایی ٢٥ کیلۆمەتر لەیەک کاتژمێردا بفڕێ.



شاخێکی سەر لە ئاسمان
کۆهسارێکی لە دامان
بەرامبەر ئەو کۆهسارە
دەشت و دۆڵێ دیارە
سەدان کێوی بەرز بەرز
پەلیان کوتاوەتە ئەرز
بەهەشتێ لە دارستان
وا لە سەر سنگی کوێستان
لەگەڵ گوڵ وگوڵاڵە
بەرگ و گیا و هەڵاڵە



لەنێو لەپ و دەستی شاخ
لەنێو سنگی شاخ و داخ
سروە لەگەڵ بۆنی گوڵ
لەنێو دەشت و پاڵ و دۆڵ
بۆنی گوڵ تێکەڵ دەکا
کۆی دەکاتەوەو دەیبا
دەیبا و دەڕوا بۆ دامەن
بۆ سەر کێو و سەر چیمەن
با لەگەڵ گوڵ وا دەڕوا
لەگەڵ سرووشت سوڕ دەخوا

هەردوکیان وەکو باران
وەکو شنەی بەهاران
مەستن و مەست و سەرخۆش
بۆنی خۆشیان دەبا هۆش
هەر لەم سروشتە جوانە
هەنگ و مەل و پەروانە

بەسەر گوڵ و بەرگ و گیا
لە دۆڵ و دڵی چیا
دەڕۆن، دەسوڕێنەوە
پاشان دەگەڕێنەوە





لەسەر بەرگ و گۆڵ و چڵ
پەپولە و هەنگ و بولبول
هەنگی نێو کێو و نێو دار
دەسوڕێنەوە لە خوار
لەنێو گوڵاڵە و گوڵزار
دێن و دەچن بە هەزار
یەکەیەکە دەکەن بۆن
لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ دەڕۆن
دەڕۆن، گوڵ دەکەنەوە
شیری گوڵ دەخۆنەوە

هەر ئەو شیرە بۆن خۆشە
وەکو بۆنی وەنەوشە
دەخۆن و تێر دەمژن
لەژێر سێبەر و ڕۆژن
بۆ لای خونچەی کراوە
لەوێ پەخش و بڵاوە

خونچەی گوڵاڵەی شیرین
گوڵی پێنج پەڕ و نەسرین
یان لەسەر گوڵی هێرۆ
پاشان بۆ سەری شەوبۆ



گوڵەبەڕۆژە و ژاڵە
یاس و کەتان و لاڵە
گوڵە خەنە و یاسەمین
مەریەم و سەرۆی ڕەنگین
موحەمەدی و گوڵەزەرد
گولاڵەی نێو دۆڵ و هەرد

لەنێو دار و چیا و سەنگ
لەنێو گوڵی ڕەنگاوڕەنگ
لەگەڵ سرووشتی قەشەنگ
بە هەزاران هەزار هەنگ



لەنێوی ئەو شاخانە
لە بەینی ئەو دارانە
کاریان بەرهەم هێنانە
وەکو کارگە و کارخانە
بەرهەمی خۆشی هەنگوین
دەرمانە بۆ گیان و خوێن

دەرمانێکە و شفایە
موعجیزەیەکی خوایە
بۆ هەنگ وەحی نێراوە
بەهرەیان پێدراوە



بۆ خۆیان شاریان هەبێ
ووڵات و کاریان هەبێ
ماڵ و جێگایان هەبێ
شوێن و ڕێگایان هەبێ
ماڵ و لانە و ووڵاتیان
چرکە و خۆڵەک و کاتیان

لەتێکۆشانن لە دەر
لەم سەر دەچن بۆ ئەو سەر
لەنێو بەرد و تاشی کێو
لەنێو لق و دار و شێو



تێدەکۆشن، کاردەکەن
هەر هەنگوێن عەمبار دەکەن
هەنگوێنی دەرمانی دەرد
خواردنەوەی پاک و زەرد
هەر مرۆڤێ کە بیخوا
بە ووتەی قورئان و خوا
هەم دەرمانە و هەم دەوا
نەخۆشی و دەرد لادەبا
ئەو ڕەنگاوڕەنگ و جوانە
دەرمانی گشت دەردانە



ئایەتە بۆ ئەوانە
ئەو گەل و نەتەوانە
کە هەنگوین دەخۆنەوە
هزر و بیر دەکەنەوە
هەنگێکی ئازا و ئیش کەر
لە شانەکەی هاتە دەر
شانەی شەش گۆشەی مۆمی
نووکێکی تیژ لە دەمی
فڕی و باڵی گرت و چوو
دەیان هەنگی کەوتە دوو



بەشێکیان شانە و مۆم ساز
بە وردەکاری و سەد راز
کاریان لەنێو لانە بوو
ئیشیان لەسەر شانە بوو



هەندێ ئیشکەر دەگەڕان
بەسەر گوڵدا دەسوڕان
دەچوونە نێو شانەوە
هەنگوینیان دەڕشانەوە
ئەم جار مەلیکەکەیان
دەستوری دەرکرد بۆیان



ووتی: من ئاشتی خوازم
هیچ کاتێ جەنگ ناخوازم
بەڵام ئەگەر هەرکەسێ
بەرامبەرمان بووەستێ
ئێمە مەرگمان لەپێشە
چزمان کردۆتە پیشە
بە چزو نووک جەنگ دەکەین
خۆمانیش لە بەین دەبەین

